# ستانداردەکانی قوتابخانە لەگەڵ نیشاندەرەکان و وەسفکارەکان

| بوارەکانی ئەدا | ستانداردەکان | نیشاندەرەکانی ئەدا | وەسفکارەکان | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ئاستی ١ | ئاستی ٢ | ئاستی ٣ | ئاستی ٤ |
| یەکەم: سەرکردایەتی و بەڕێوەبردن | ١- دیدو پەیامی قوتابخانە بەرز و گونجاون و بە ڕوونی گوزارشتیان لێکراوەو ئاراستەی گونجاو لە خۆدەگرن بۆ پەرەپێدانی قوتابخانە. | ١-١ نوسراوەکانی قوتابخانە بە ڕوونی دیدو پەیامی قوتابخانە دەخەنە ڕوو و جەخت لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی ئەدای قوتابیان دەکاتەوە.<br>١-٢ دیدو پەیامی قوتابخانە ڕەنگدانەوەی پێوەرە نێودەوڵەتیەکان و ڕەهەندی خۆجێی هەبێت.<br>١-٣ تەواوی کۆمەڵگەو لایەنە پەیوەندیدارەکانی قوتابخانە بەشداریان کردووە لە داڕشتنی دیدو پەیامی قوتابخانەدا.<br>١-٤ گشت لایەنە پەیوەندیدارەکانی قوتابخانە پابەندن بە دید و پەیامەکە. | قوتابخانە دیدی تایبەت بە خۆی نیە یان گونجاو نیە واتە (تاك لایەنە داڕێژراوە بە بێ بەشداری ئەندامانی کۆمەڵگەی قوتابخانە، یان لێی تێنەگەیشتوون ،یان کۆپی کراوە، یاخود بنەماکانی دیدی تێدا نیە) | دیدی قوتابخانە ڕوون و گونجاو نیەو گشتی یە و هەندێ (لە نیوە کەمتر) لە ئەندامانی کۆمەڵگەی قوتابخانە بەشدارن لە داڕشتنی. وە هاوکار نەبووە لە بەرەوپێشبردنی ئاستی ئەدای قوتابخانە . | دیدی قوتابخانە ڕوون و ئاشکرایەو پەیامەکەش گونجاوە، زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگەی قوتابخانە(لە نیوە زیاتر) بەشدارن لە داڕشتن و پاڵپشتی کردنی. وە هاوکار بووە لە بەرەوپێشبردنی ئاستی ئەدای قوتابخانە . | دیدی قوتابخانە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، و داهێنانی پێوە دیارە ڕەنگدانەوەی خواستی بەرزی قوتابیان و بە سودوەرگرتن لە پێوەری نێو دەوڵەتییەو بەرهەمی تایبەتی خودی قوتابخانەکە بێت پاڵپشت بە تێگەیشتنی تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگای قوتابخانە. و بەشێوەیەکی کارا هاوکارە لە باشتر کردنی ئەدای قوتابخانە |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ٢- قوتابخانە بە شێوەیەکی وردو ڕاستگۆیانە خودهەڵسەنگاندن ئەنجام دەدات، بەشێوەیەکی کاریگەر دەرەنجامەکان بۆ گەڵاڵەکردنی پلانی گونجاوی پەرەپێدانی قوتابخانە بەکاردەهێنێت. | ٢-١ خود هەڵسەنگاندنی قوتابخانە پشت ژیە بەڵگە دەبەستێت، وە ئەو بەڵگانەی بەدەست دەهێنرێن لە ئەنجامی چاودێری کردن و شرۆڤەکردن و وەرگرتنی بۆچوونی قوتابیان و مامۆستایان و تیمی دیکەو دایبابان و کۆمەڵگەی خۆجێیی.<br>٢-٢ سەرکردایەتی قوتابخانەو، مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانە دەزانن چۆن خاڵە بەهێزو لاوازەکانی ئەدای قوتابخانە بە دروستی شیبکەنەوە.<br>٢-٣ پلانی ستراتیژی قوتابخانە پرسە زۆر گرنگەکان بە پێی پێشگرنگی(اولویة) دادەنێت و بۆ بەرەوپێشبردن و هەڵدەستن بە تێك هەڵکێشکردنی ڕاسپاردەکانی هەڵسەنگاندنە دەرەکیەکان، هەروەها ئەم پلانانە ئامانجی بەرزیان هەیەو کردارو خشتەی کات دیاریکراوی گونجاو لە خۆدەگرن. | قوتابخانە خود هەڵسەنگاندن ئەنجام نەداوە یاخود پلانی پەرەپێدانی نیە. | قوتابخانە خود هەڵسەنگاندنی هەیە بەڵام پشت نابەستێت بە بەڵگەی ڕوون، وە پلانی پەرەپێدانی هەیە بەڵام گشتیە جەخت دەکات لەسەر هەندێك کاری لاوەکی لە جیاتی باشترکردنی کوالیتی فێرکردن، لەوانەیە پلانی پەرەپێدانی کۆپی کراو بێت بە بێ پشت بەستن بە خود هەڵسەنگاندنی یان ڕاسپاردەکانی هەڵسەنگاندنی دەرەکی تێدا نیە. | قوتابخانە خود هەڵسەنگاندنی ئەنجامداوە پشت بەستوو بە هەندێك بەڵگەو پلانی پەرەپێدانی ئامادەکردووە کە کارە سەرەکیە گونجاوەکانی دیاری کردووە وەك ئەنجامی هەڵسەنگاندنی دەرەکی پێشووتر و جەخت کردن لە باشترکردنی کوالیتی فێرکردن. | قوتابخانە خود هەڵسەنگاندنی ئەنجامداوە بە شێوەیەکی وردو ڕاستگۆیانەو پشت بەستوو بە بەڵگەی واقعی لە چەندین سەرچاوە، وە پلانێکی پەرەپێدانی کاریگەری هەیە بە شێوەیەکی ڕوون بۆ باشترکردنی کوالیتی فێرکردن و فێربوون بە گوێرەی خشتەیەکی کات دیاریکراو کە ڕاسپاردەکانی هەڵسەنگاندنی دەرەکی تێدایە. |
| | ٣- سەرکردایەتی قوتابخانە کەشێکی ئەرێنی دەرەخسێنێت، تێیدا قوتابیان، مامۆستایان و کارمەندەکانی دیکە دەتوانن گەشە بکەن و دایبابانیش باش دەینرخێنن. | ٣-١ سەرکردایەتی و مامۆستایان و کارمەندو قوتابیەکان هەمان ئامانجیان هەیەو کۆدەنگیەکی بەهێز هەیە دەربارەی ئامانجی قوتابخانە، لەگەڵ بوونی تێروانینێکی ئەرێنی سەبارەت بە گۆڕانکاری و پەرەپێدانەوە.<br>٣-٢ سەرکردایەتی قوتابخانە بەرپرسیاریەتی دەگرنە ئەستۆ لە پەیوەست بوون بە فێربوون و | کارکردنی دەستەی کارگێڕی قوتابخانە کلاسیکی و لاوازە و تاك ڕەویەو ڕێزو خۆشەویستی لە نێوانیاندا بوونی نیەو پێشەنگێکی باش نیە بۆ | دەستەی کارگێڕی کلاسیکیەو کەمتر بە کۆمەڵ کاردەکەن، کاروبارەکانی جێی ڕەزامەندیە، ژینگەیەکی لەبار بۆ ڕێزگرتنی کۆمەڵگەی | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە بە کۆمەڵ کاردەکەن و لە پێناو ڕەخساندنی ژینگەیەکی لەبار بۆ پێشخستنی قوتابخانەو بەرز | قوتابخانە دەستەی کارگێڕی چالاك و کارایە، کاردەکەن وەك یەك تیم، پێشەنگ و پابەندن بە پەرەپێدانی قوتابخانەو فەراهەمکردنی ژینگەیەکی لەبار بۆ |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | سەلامەتی و پەرەپێدانی قوتابییەکانەوە.<br>٣-٣ قوتابیان شانازی بە قوتابخانەکەوە دەکەن، کارو دەستکەوتەکانیشیان لە قوتابخانە نمایش دەکرێت و بۆنەیان بۆ ڕێکدەخرێت.<br>٣-٤ سەرکردایەتی قوتابخانە نمونەیەکی باشە بۆ سەرجەم کۆمەڵگەی قوتابخانەو بایەخ بە خۆشگوزەرانی و سەلامەتی مامۆستایان و کارمەندانی دیکە دەدات و کار لەسەر بنیاتنانی تواناکانیان دەکات.<br>٣-٥ قوتابیان و مامۆستایان و کارمەندان و دایبابان ڕێز لە سەرکردایەتی قوتابخانەکە دەگرن. | قوتابیان و ژینگەیەکی لەبار بۆ فێربوون نەڕەخساوە. | قوتابخانە سنووردارە لە نێویاندا. وە هیچ بەڵگەیەك نیە بیسەلمێنێت کە ئاراستە کردنی هەبێت بۆ پێشخستنی قوتابخانە. | ڕاگرتنی مامۆستایان و کارمەندان و فێرخوازان.<br>ڕێزگرتن لەنێو زۆربەی کۆمەڵگەی قوتابخانە هەیە. دایبابانیش ڕێز لە ئاراستە کردن و بۆچونی قوتابخانە دەگرن ، شانازی دەکەن بە قوتابخانەوە | کاروباری قوتابخانە ڕێزو خۆشەویستی دەچێنن لە نێویاندا. وە قوتابخانە سەرکەوتنی پێوە دیارە . |
| | ٤- سەرکردایەتی قوتابخانە چالاك و کارایە لە پشتگیری بۆ پێشخستنی پرۆسەی فێرکردن و فێربوون، هەروەها لایەنەکانی دیکەی کاری قوتابخانە. | ٤-١ سەرکردایەتی قوتابخانە سەرکردایەتیەکی پەروەردەیی کارا دەستەبەر دەکات بۆ مامۆستایان و کارمەندانی دیکەو پشتگیری لە میتۆدە هاوچەرخەکانی فێرکردن و فێربوون دەکات.<br><br>٤-٢ سەرکردایەتی قوتابخانە بە شێوەیەکی کارا هەڵدەستێت بە ئاراستەکردنی کاری بە دواداچوون و بەرەوپێشبردنی پرۆسەی فێرکردن و فێربوون و هەروەها بەرەوپێشبردنی کاری کارمەندەکانی تر. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە کلاسیکیە و ئاراستەکردنێکی ڕاستی نیە بۆ بەکارهێنانی ڕێگەکانی وانەوتنەوە و فێرکردنی نوێ ، چاودێری و پاڵپشتیشی ناکات لە کردەی فێرکردن و فێربوون . | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە هەندێك(لە نیوە کەمتر) لە مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانە ئاراستە دەکات و پاڵپشتی بەکارهێنانی ڕێگەکانی وانەوتنەوە و فێرکردنی نوێ دەکات ، و چاودێریی کردەی فێرکردن و فێربوون دەکات . | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە زۆربەی (لە نیوە زیاتر) مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانە ئاراستە دەکات و پاڵپشتی بەکارهێنانی ڕێگەکانی وانەوتنەوە و فێرکردنی نوێ دەکات و بەدواداچوون دەکات بۆ باشترکردنی کردەی فێرکردن و فێربوون لەمیانی سەردانیکردنی پۆل و ڕەخساندنی ڕاهێنان و پێدانی فیدباك و | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە هەموو مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانە ئاراستە دەکات پاڵپشتی بەکارهێنانی ڕێگەکانی وانەوتنەوە و فێرکردنی نوێ دەکات ، و بەدواداچوون دەکات بۆ باشترکردنی کردەی فێرکردن و فێربوون لەمیانی سەردانیکردنی پۆل و ڕەخساندنی ڕاهێنان و پێدانی فیدباك و دابینکردنی پێداویستیەکان و هاندانی |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | دابینکردنی پێداویستیەکان. | سەرکەوتووەکان. |
| | ٥– قوتابخانە داهات و پێکهاتەی باڵەخانە بە شێوەیەکی چالاك و کاریگەر بەڕێوەدەبات. | ٥–١ قوتابخانە بە شێوەیەکی گونجاو پێداویستیەکانی خەرجی خۆی دیاری دەکات و چالاکانە و بەردەوام چاودێری جێبەجێکردنی دەکات.<br><br>٥–٢ قوتابخانە باڵەخانەو سەرچاوەکانی بە باشی بەکاردەهێنێت لە پێناو پرۆسەی فێربوون و چالاکیەکانی دەرەوەی پۆل.<br><br>٥–٣ قوتابخانە کاری پێویست ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی باڵەخانەکە و شوێنەکەی سەلامەت بن پاك و خاوێن و سەرنج ڕاکێشن و پارێزگاری لێکراوەو تەوالێتەکانیشی پاك و خاوێن ڕاگیراوە. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە سەرچاوەو باڵەخانەو یەکەکانی تر بە باشی بەکارناهێنێ و ناپارێزێ و هیچ چالاکیەکی دەرەوەی پۆل بوونی نیە تیایدا ، وە ژینگەی قوتابخانە گونجاو نیە بۆ فێربوون. | کارگێڕی قوتابخانە پارێزگاری لە بەشێك لە باڵەخانەو یەکەکانی تر دەکات بە شێوەیەك کە کەش و هەوای پەسەند دەستەبەر دەکات بۆ بەشێك لە قوتابیان و چالاکیەکانی سنوورداره. | بەکارهێنانی باڵەخانەو و پێکهاتەکانی قوتابخانە بە شێوەیەکی گونجاو بۆ ئەنجام دانی چالاکی پۆل و دەرەوەی پۆل. | بەکارهێنانی باڵەخانەی قوتابخانەو سەرچاوە ماددیەکان بە شێوەیەکی چالاك ، وە ژینگەی قوتابخانە سەرنج ڕاکێشەو پاراستنی باڵەخانەو پێکهاتەکانی بە شێوەیەکە کە گونجاوە بۆ ئەنجام دانی گشت چالاکیەکانی دەرەوەی پۆل. |
| | ٦– قوتابخانە سەرچاوە مرۆییەکانی خۆی بە زیرەك و کارا بەڕێوە دەبات. | ٦–١ قوتابخانە ژمارەی پێویستی لە مامۆستایانی پسپۆڕ هەیە (لە نێویاندا ڕێنماییکاری پەروەردەیی) و بە شێوەیەکی گونجاو خراونەتەکار.<br><br>٦–٢ قوتابخانە لە خستنە کاری مامۆستایانیدا ڕەچاوی دادپەروەری لە دابەش کردنی ئەرکە جیاوازەکاندا دەکات و لە پۆلەکانیش ژمارەی قوتابیان هاوسەنگن.<br><br>٦–٣ مامۆستاو کارمەندانی قوتابخانە بە باشی ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن و بەرپرسیاریەتیەکان هەڵدەگرن. | قوتابخانە ژمارەی مامۆستایانی پسپۆڕی زۆر کەمەو مامۆستایان کەوتوونەتە ژێر فشاری ئەرکەکانیان . ئەوەش وایکردووە مامەڵەی نادرووست لەگەڵ قوتابیان بکەن و ژمارەی قوتابیان لە | قوتابخانە ژمارەی مامۆستایانی پسپۆڕی وەك پێویست نیە و پابەندی دەوام نین<br><br>بۆ پڕکردنەوەی پسپۆڕییەکان و ژمارەی قوتابیان لە پۆلەکاندا یەکسان نیە،و | قوتابخانە ژمارەیەك لە مامۆستایانی هەیە بەپێی ئەرك و پسپۆڕییان (لە نێویاندا ڕێنمایکاری پەروەردەیی) و بە شێوەیەکی دادگەرانە و هاوسەنگ دابەشکراون، و مامۆستایان ئەرکەکانیان جێبەجێی دەکەن و پابەندن بە | قوتابخانە ژمارەی پێویستی مامۆستایانی هەیە بەپێی ئەرك و پسپۆرییان (لە نێویاندا ڕێنمایکاری پەروەردەیی) و بەشێوەیەکی دادگەرانە و هاوسەنگ دابەشکراون بەگوێرەی ژمارەی قوتابیان ،مامۆستایان لەئەرکەکانیان ڕازین و بەشێوەیەکی تەواو |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ٦-٤ مامۆستاو کارمەندان پابەندبوونی خۆیان بۆ قوتابخانە دەخەنە ڕوو و بەشێوەیەکی ڕێك پێك دەوام دەکەن و ئارەزوومەندانە کاتی خۆیان بۆ چالاکیەکانی دیکەی قوتابخانە تەرخان دەکەن. | پۆلەکاندا هاوسەنگ نیە. | مامۆستایان کەوتوو نەتە ژێر فشاری ئەرکەکانیان و ئەوەش تاڕادەیەك وایکردووە مامەڵەی نادرووست لەگەڵ قوتابیان بکەن. | دەوامکردن و چالاکی فێرکاریی ئەنجام دەدەن . | جێبەجێی دەکەن و پابەندن بە دەوامکردن و خۆبەخشانە کاتی زیادە تەرخان دەکەن بۆ ئەنجامدانی چالاکیە فێرکاریەکان بەشێوەیەکی کارا. |
| | ٧- قوتابخانە ڕێکاری خۆی هەیە بۆ بەڕێوەبردنی کوالیتی کە چاودێری کردنی کوالیتی خزمەت گوزاریەکەشی دەگرێتەوە. | ٧-١ بە وردی و بە وریایەوە شیکاری بۆ ئەنجام و دەرهاویشتەکانی قوتابیان دەکرێت.<br>٧-٢ بە بەردەوامی و بە وردی چاودێری وانەکان و کاری قوتابیان دەکرێت بۆ دڵنیابوون لەوەی کوالیتیەکی بەرزیان هەیەو ئامانجەکانی پرۆگرامی خوێندن بە دەست هاتوون. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە بایەخ نادات بەبڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری جۆرباشی گشتگیر، وە خودهەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی ئەنجامەکان و چاودێری پرۆسەی فێرکردن و فێربوون ناکات و ڕۆڵی ڕێنماییکاری پەروەردەیی فەرامۆش دەکات. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە هەڵدەستێت بە خودهەڵسەنگاندن بەشێوازێکی کۆنی دوور لە هەوڵی پەرەپێدان و چاکسازی بەبێ هەماهەنگی لەگەڵ ڕێنمایکیاری پەروەردەیی و بایەخێکی کەم بە شیکردنەوەی ئاستی قوتابیان دەدات . | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە هەوڵی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری جۆرباشی گشتگیر دەدات و، هەڵدەستێت بەخودهەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی ئاستی قوتابیان بە هەماهەنگی لەگەڵ ڕێنماییکاری پەروەردەیی بۆ دەستەبەرکردنی ئەنجامی پەروەردەیی گونجاو . | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە زۆر بە باشی و بەبەردەوامی کاردەکات لەسەر بڵاوکردنەوەی جۆرباشیی گشتگیر و خودهەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی چالاکیەکان و دەستنیشانکردنی خاڵە بەهێز و لاوازەکان لە کارەکانیاندا بۆ گەیشتن بە بەرزترین ئاستی ئەنجامەکانی پرۆسەی فێرکردن و فێربوون. |
| | ٨- قوتابخانە هەڵدەستێت بە هاندانی مامۆستایان و کارمەندان وە بە شێوەیەکی کارا پشتگیریان دەکات لە | ٨-١ مامۆستایان و کارمەندان بە ڕێکی و ڕاستگۆیانە خودهەڵسەنگاندن ئەنجام دەدەن و هەڵدەستن بە ئەنجامدانی کاری خۆ فێرکردن و | قوتابخانە پاڵپشتی مامۆستایان ناکات بۆ ئەنجامدانی خودهەڵسەنگاندن، | قوتابخانە پاڵپشتی هەندێك لە مامۆستایان دەکات بۆ ئەنجامدانی | قوتابخانە پاڵپشتی زۆربەی مامۆستایان دەکات بۆ ئەنجامدانی خودهەڵسەنگاندن، و | قوتابخانە پاڵپشتی تەواوی هەموو مامۆستایان دەکات بۆ ئەنجامدانی |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | پەرەپێدانی پیشەیاندا.<br>□<br>□<br>□<br>□<br>□<br>□<br>□<br>□ | توێژینەوە لە پێناو باشترکردنی ئەدایاندا.<br>٨-٢ کارگێڕی قوتابخانە بە وردی هەڵسەنگاندن بۆ پێداویستیەکانی ڕاهێنان دەکات (لە نێویاندا پێداویستیەکانی پەیوەست بە فێرکردنی ئەو قوتابیانەی کە خاوەن پێداویستی پەروەردەی تایبەتن و دژواری سایکۆلۆژیان هەیە)، پشتیوانی لە بەشداری کردنی مامۆستایان و کارمەندان دەکات لە خولەکانی ڕاهێنان و هانی سەردان گۆڕکی لە پێناو پەرەپێدانی پیشەیان و بەدواداچوون دەکات بۆ بنیاتنانی تواناو بەرەوپێشچوونی مامۆستایان و کارمەندان.<br>٨-٣ مامۆستایان و کارمەندان دوای بەشداربوونیان لە خولی ڕاهێنان، ڕاپۆرت ئامادە دەکەن لە بارەی ئەوەی فێری بوون و پیادەی دەکەن و زانیاریە تازەکان بۆ هاوکارانیان دەگوازنەوە. | وەهانیان نادات بۆ ئەنجامدانی سەردان گۆڕکێ لە نێوان خۆیاندا بۆ پەرەپێدانی پیشەیی.وە هاندان نیە بۆ بەشداریکردن لە خولەکانی ڕاهێناندا. | خودهەڵسەنگاندن، بەڵام کار بە ئەنجامەکانی ناکرێ و سەردان گۆڕکێی نێوان خۆیان فەرام ۆش دەکەن وە هیچ ڕاپۆرت پێشکەش ناکەن سەبارەت بە ڕادەی سود بینینیان. | دیاریکردنی پێداویستیە فێرکاریەکان لەکاتی ئامادەبوونیان لە چالاکیەکان و سەردان گۆڕکێی نێوان خۆیان بەڵام بەدواداچونی لە ئاستێکی بەرزدا نیە بۆ جێبەجێ کردنی ئەوەی فێری بوون یاخود پێشکەش کردنی ڕاپۆرت بەوەی جێبەجێ کراوە. | خودهەڵسەنگاندن بەشێوەیەکی ڕاستگۆیا نە و ڕێك وپێك، پێداویستیەکانی ڕاهێنان هەڵدەسەنگێنێت و هانی مامۆستایان دەدات بۆ ئەنجامدانی سەردان گۆڕکێ لەنێوان خۆیاندا بۆ پەرەپێدانی پیشەییان و پێشکەشکردنی ڕاپۆرت لەسەر ئەوەی فێری بوون لە سەردان گۆڕکێکەدا و دەیدەن بە هاوڕێکانیشیان. |
| دووەم: فێرکردن و فێربوون | ٩- پرۆسەی بڕیاردان کارایەو لەسەر بنەمای ڕاوێژکردنە، هەروەها کارکردن وەك یەك گروپە لە نێو سەرجەم ئەندامانی قوتابخانە. | ٩-١ هەر کێشەیەك لە قوتابخانەدا ڕوویدات بە شێوەیەکی بابەتیانەو بە کۆمەڵ چارەسەر دەکرێن، کە ڕێزگرتنی دوو لایەنەش لە نێوان سەرجەم ئەندامانی قوتابخانەکەدا دەپارێزرێت.<br>٩-٢ مامۆستایانی قوتابخانەو کارمەندانی دەرفەتی ئەوەیان هەیە بەشداری بکەن لە گفتوگۆکانی پەیوەست بە بڕیارو پلانەکان و ئەو بڕیارانەشی کە دەدرێن بڕیاری ڕوون و ئاشکراو باشن. | بەڕێوەبەری قوتابخانە تاك لایەنانە بڕیار دەدات و کارمەندانی قوتابخانە بەشداری پێ ناکات و هیچ دەستەڵاتێکیان ناداتێ و کارەکانی قوتابخانە تۆمار ناکات، ئەمەش وا دەکات قوتابخانە ناڕێك وپێك بێت و وەڵامگۆی | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە بەشداری بە کەمێك (لە نیوە کەمتر) لە کارمەندانی قوتابخانە دەکات لە بڕیاردان و تاك لایەنانە بڕیار دەدات، و کەمێك لە دەستەڵاتەکان دابەش دەکات و | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە بەشداری بە زۆربەی کارمەندانی قوتابخانە دەکات (لە نیوە زیاتر) لە بڕیاردان و چارەسەرکردنی کێشەکان و هەندێك لە دەستەڵاتەکان دابەش دەکات لەنێوانیاندا بۆ | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە بەشداری بەسەرجەم کارمەندانی قوتابخانە دەکات لە بڕیاردان و چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوەیەکی کاریگەر، دەستەڵاتەکان دابەش دەکات لەنێوانیاندا بەشێوازێکی |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ٩-٣ مامۆستایان و کارمەندان بە شێوەیەکی بەرپرسیارانە ڕەفتار دەکەن و دەست پێشخەری دەخەنە ڕوو.<br><br>٩-٤ لیژنەکانی قوتابخانە هەندێ ئەرکیان پێ سپێردراوە لە چوارچێوەیەکی گشتی کە بە ڕوونی دیاری کراوە. | ویستەکانی کارمەندان و کۆمەڵگەی مەدەنی نەبێت. | لاوازە لە چارەسەرکردنی کێشەکان و ڕوونکاری (شەفافیەت) لە بڕیارەکانیدا نیە. | بەجێ هێنانی هەر ئەرکێك. | ڕوون و ئاشکرا. |
| | ١٠- دەستەی کارگێڕی و مامۆستایانی قوتابخانە بە شێوەیەکی کارا پلان بۆ فێربوونی قوتابییەکان دادەڕێژن. | ١٠-١ ڕێکخستنی ناوەڕۆك و وتنەوەی پرۆگرامی خوێندن بە شێوەیەکی کارا ئەنجام دەدرێت و بە بەردەوامی پێداچونەوەیان بۆ دەکرێت و پەرەیان پێدەدرێت.<br><br>١٠-٢ پلانی ساڵانە، وەرزی، مانگانە، ڕۆژانە بە شێوەیەکی گونجاو ڕەنگدانەوەی پرۆگرامی خوێندنە.<br><br>١٠-٣ پلانە فێرکاریەکان پشت بە فێربوونی پێشووی قوتابیان دەبەستن. | هیچ پلانێکی ساڵانە و وەرزییانە یان نیە کە یەکبگرێتەوە لەگەڵ پلانی ڕۆژانەیاندا . | هەندێ لە مامۆستایان (لە نیوە کەمتر) پلانی ساڵانە و وەرزیانەیان هەیە کە لەگەڵ پلانی ڕۆژانەیاندا یەك بگرێتەوە کە جەخت لەسەر تەواوکردنی پرۆگرام بکات لە کاتی دیاری کراودا. | زۆر لە مامۆستایان (لە نیوە زیاتر) پلانیان هەیە و یەك دەگرێتەوە لەگەڵ پلانی ڕۆژانەدا بەجۆرێك جەخت لەسەر تەواوکردنی پرۆگرام بکات لە کاتی دیاری کراودا. | گشت مامۆستایان پلانی گونجاو و دروستیان هەیە (ساڵانە و وەرزیانە) کە یەك بگرێتەوە لەگەڵ پلانی ڕۆژانەیاندا وە کارایە بۆ باشتر کردنی فێربوون و فێرکردن بەجۆرێك جەخت لەسەر تەواوکردنی پرۆگرام بکات لە کاتی دیاری کراودا. |
| | ١١- میتۆدو تەکنیکی هاوچەرخ و کارا پیادە دەکرێت لە پرۆسەی فێرکردن لە قوتابخانەدا، کە هانی قوتابیان دەدات بۆ فێربوون و پاڵپشتیان دەکات بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی سەربەخۆ فێربن. | ١١-١ لە قوتابخانەدا شێوازی هاوچەرخ بەکاردەهێنرێت بۆ فێرکردن، وەك فێربوونی چالاك و کاری دوو کەسی و کاری بە کۆمەڵ، کە گونجاو بن لەگەڵ ئەو بابەتانەی دەوترێنەوە.<br><br>١١-٢ لە پرۆسەی فێرکردندا بە شێوەیەکی گونجاو هۆیەکانی فێرکردن کە لەبەردەست دایە بەکار | مامۆستایانی قوتابخانە کار بە ڕێگاکانی وانە وتنەوەی نوێ ناکەن و هانی قوتابیان نادات بۆ فێربوون و گەشە کردنیان. | مامۆستایانی قوتابخانە کار بە شێوازی وانە وتنەوەی کۆن دەکەن و ڕەچاوی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ بە | مامۆستایانی قوتابخانە کاردەکەن لەسەر بەکارهێنانی هەمەجۆرەی ڕێگاکانی وانە وتنەوە بە مەبەستی گەیاندنی پرۆسەی فێرکردن و | مامۆستایانی قوتابخانە تازەترین ڕێگاو شێوازو تەکنەلۆژیای فێرکاری سەردەم بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی پرۆسەی فێربوون کاریگەرو سەرکەوتوبێت و |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | دەهێنێ، لە نێویاندا تەکنیکە هاوچەرخەکان.<br><br>١١-٣ پرۆسەی فێرکردن بە شێوەیەکی نەرم (مرونە) تێڕامانی میتۆدە هاوچەرخەکان بەکاردەهێنێت و کارایانە چارەسەری ئەو گرفتانە دەکات کە سەرهەڵدەدات.<br><br>١١-٤ لە پرۆسەی فێرکردندا بە شێوەیەکی چالاک بەشداری بە قوتابیان دەکرێت و بواریان پێ دەدات بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی سەربەخۆ فێربن. | | کەمی دەکەن وە خواستی قوتابیان بۆ فێربوون دەستەبەر ناکەن . | فێربوون بە شێوەیەکی ڕوون و ئاسان بۆ قوتابیان دەخرێنە ڕوو وە ئامانجەکانی دەپێکێت و ڕەنگدانەوەی بەشێك لە لایەنەکانی فێرکردن و فێربوون دەردەکەوێت لەسەر پێشکەوتنی زۆربەی قوتابیان. | کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبێت لەسەر گەشەی قوتابیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ وە چالاکی هەمە جۆر بکەن. |
| | ١٢- شارەزایی باشی مامۆستایان لە پسپۆڕیەکەیاندا بۆتە هۆی باشترکردنی پرۆسەی فێرکردن لە قوتابخانەدا. | ١٢-١ پرۆسەی فێرکردن ڕەنگی داوەتەوە لەو زانینە گشتی و چەمکە تایبەت و ناوەڕۆکانەی کە خوێندراون.<br><br>١٢-٢ پرۆسەی فێرکردن ڕەنگدانەوەی کارامەییە کاریگەرەکانی مامۆستایانە لە خستنە ڕووی چەمکەکان و ناوەڕۆکی بابەتەکان، بە شێوازێکی پوخت و ئاسان، بە چەشنێك بەرژەوەندی قوتابیان دابین بکات. | مامۆستایان شارەزایی باشیان نیە لە پسپۆڕیەکانیان و کارامەییەکانی فێرکردنی کارا دەستەبەر ناکەن. | هەندێك لە مامۆستایان (لەنیوە کەمتر) شارەزایی باشیان هەیە لە پسپۆڕیەکانیان و کارامەییەکانی فێرک ردنی کارا دەستەبەر دەکەن. | زۆربەی مامۆستایان (لە نیوە زیاتر) شارەزایی باشیان هەیە لە پسپۆڕیەکانیان و کارامەیی فێرکردنی کارا دەستەبەر دەکەن بە باشی. | گشت مامۆستایان شارەزایی تەواویان هەیە لە پسپۆڕیەکانیاندا، و کارامەییە چالاکەکانیان لە پێشکەشکردنی چەمکەکان و ناوەڕۆکی بابەتەکان بە شێوە یەکی یەکگرتوو و ئاسان بۆ تێگەیشتن، لە ئاستی فێرکردندا ڕەنگی داوەتەوە. |
| | ١٣- مامۆستایانی قوتابخانە بە شێوەیەکی کارا لەگەڵ قوتابیان ئاوێتە دەبن بۆ بەرەوپێشبردنی فێربوونیان. | ١٣-١ پرۆسەی فێرکردن ڕەنگدانەوەی کارامەیی باشی مامۆستایانە لە پەیوەندی زارەکی و نازارەکی، لە پرسیارکردن و گوێ گرتندا.<br><br>١٣-٢ مامۆستایان و کارمەندان بە شێوەیەکی کارا | مامۆستایان بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ قوتابیان ئاوێتە نابن و پەیوەندیان لەگەڵ ناکەن، ئەمەش | ئاوێتە بوونی بەشێکی کەم لە مامۆستایان (لە نیوە کەمتر) لەگەڵ قوتابیان و کەمێکیان | ئاوێتە بوونی زۆربەی مامۆستایان (لە نیوە زیاتر) لەگەڵ قوتابیان بە شێوەیەکی گونجاو، وە لە | سەرجەم مامۆستایان ئاوێتە بوون لەگەڵ قوتابیان و گوێ لە ڕاو و بۆچوونەکانیان دەگرن بە شێوەیەکی ڕوون بە |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | هەڵدەستن بە بەهێزکردنی پەیوەندی کردن و هاوکاری کردن لە نێوان خۆیان و قوتابییەکاندا، هەروەها لە نێوان خودی قوتابییەکاندا. | بۆشایەکی گەورە لە نێوانیان دروست دەکات و کاریگەری نەرێنی لەسەر پرۆسەی فێرکردن و فێربوون دروست دەکات. | وەڵامی پرسیارو پێشنیازەکانیان دەدەنەوەو بە شێوەیەکی لاواز. | پەیوەندیدان لەگەڵ زۆربەیان و گوێ لە زۆربەی بیرو بۆچوونەکانی قوتابیان دەگرن. | مەبەستی گەشە کردنیان بە شێوەی تەواو و درووست. |
| | ١٤- پرۆسەی فێرکردن لە قوتابخانەدا بە شێوەیەکی گونجاو ڕەچاوی جیاوازی تاکە کەسی قوتابیان دەکات، لە نێویاندا ئەوانەی دژواری سایکۆلۆجیان هەیە و ئەوانەی خاوەن پێداویستیەکی پەروەردەیی تایبەتن توانای فێربوونیان زیاد دەکات. | ١٤-١ فێرکردن ڕەنگدانەوەی زانیاری باشی مامۆستایانە بە هەل و مەرجی تاکە کەسی و پێداویستی و تواناکانی قوتابیەکان و ئامادەییان هەیە بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای زانیاری و ئامۆژگاریەکانی ڕێنمایکاری پەروەردەیی کار بکەن.<br><br>١٤-٢ پرۆسەی فێرکردن چەند میتۆدێك بەکار دەهێنێت بۆ پشتیوانی کردن لە فێربوونی تاکەکان و پلان بۆ فێربوونی ئایندەیان دادەنێت.<br><br>١٤-٣ فێرکردن ڕەنگدانەوەی باوەڕبوونە بە توانای هەر قوتابیەك بۆ سەرکەوتن.<br><br>١٤-٤ پرۆسەی فێرکردن ئەرك و چالاکی جیاواز بەکاردەهێنێت کە گونجاو بن لەگەڵ توانا جیاوازەکانی قوتابیاندا. | هەموو مامۆستاکان ڕەچاوی جیاوازی تاکە کەسی فەرامۆش دەکەن و بایەخ نادەن بە توانا کانی قوتابی و ڕۆڵی ڕێنماییکاری پەروەردەیی فەرامۆش دەکرێت، بۆیە فێرکردن ناگونجێ لەگەڵ توانا جیاوازەکانی قوتابیان . | هەندێك لە مامۆستایان (لە نیوە کەمتر) ڕەچاوی جیاوازی تاکە کەسی دەکەن بە پشت بەستن بە شارەزایەکانی خۆیان لە فێربووندا و ڕۆڵی ڕێنماییکاری پەروەردەیی فەرامۆش دەکرێت، بۆیە فێرکردن ناگونجێ لەگەڵ توانا جیاوازەکانی قوتابیان . | زۆربەی مامۆستایان(لە نیوە زیاتر) ڕەچاوی جیاوازی تاکە کەسی (الفروق الفردية) دەکەن بە پشت بەستن بەو زانیاریانەی کە لە ڕێنماییکاری پەروەردەیی دەستیان دەکەوێت ، و بەکارهێنانی کارامەیەکانی فێربوونی تاکەکان بە شێوەیەك بگونجێت لەگەڵ توانا جیاوازەکانی قوتابیان و پاڵپشتی کردن و باوەڕبوون بە توانای بەدەستهێنانی دەرئەنجامی باش. | هەموو مامۆستایان ڕەچاوی جیاوازی تاکە کەسی (الفروق الفردية) دەکەن بە شێوەیەکی کاریگەر لە ڕێی شارەزایی باشیان بۆ دۆخ و پێداویستیەکان و توانای تاکە کەسیی، بە پشت بەستن بە زانیاریەکانی دەستکەوتوو لە ڕێنماییکاری پەروەردەیی. بەکارهێنانی کارامەیەکانی فێربوونی تاکەکان بە شێوەیەك بگونجێت لەگەڵ توانا جیاوازەکانی قوتابیان و پاڵپشتی کردنی باوەڕبوون بە توانای بەدەستهێنانی |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | دەرئەنجامی باش. |
| | ١٥– قوتابخانە بە شێوەیەکی چالاك و بەردەوام هەڵدەستێت بە چاودێریکردن و هەڵسەنگاندنی بەرەوپێشچوونی قوتابیەکان. | ١٥–١ مامۆستایانی قوتابخانە چەند ڕێکارێکی گونجاویان هەیە بۆ هەڵسەنگاندن و بەرەو پێشچوونی قوتابیان.<br><br>١٥–٢ قوتابیان فیدباکی کاریگەریان دەست دەکەوێت و یارمەتیان دەدات بۆ بەرەوپێشچوونیان.<br><br>١٥–٣ ڕێکارەکانی قوتابخانە بۆ تاقیکردنەوەی قوتابیان ڕوون و ئاشکراو دادپەروەرانەیەو ئەنجامەکانیشی وردن. | مامۆستایان هانی قوتابیان نادەن بۆ پێداچونەوەی ئەنجامی هەڵسەنگاندنیان، هەروەها بە شێوەیەکی ڕون و ئاشکرا و شەفاف تاقیکردنەوەکان ئەنجام نادەن . | هەندێ لە مامۆستایان (لە نیوە کەمتر) هانی قوتابیان دەدەن بۆ پێداچونەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانیان بە شێوەیەکی کۆن و کلاسیکی وە تاقیکردنەوەکان بە شێوەیەکی ڕوون و شەفاف ئەنجام نادەن وە شیکاری بۆ ئەنجامەکان ناکەن . | زۆربەی مامۆستایان (لە نیوە زیاتر ) هانی قوتابیان دەدەن بۆ پێداچونەوەی ئەنجامەکانیان بە شێوەبەکی کارا و بەردەوام وە مامۆستایان پارێزگاری لە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان دەکەن بە شێوەیەکی ڕوون و شەفاف بۆ بەدەست هێنانی ئەنجامی بەرز. | گشت مامۆستایان هانی قوتابیان دەدەن بۆ پێداچونەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکانیان بە شێوەیەکی کارا و بەردەوام وە مامۆستایان پارێزگاری لە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکان دەکەن بە ڕوونی و شەفافی بۆ بەدەست هێنانی ئەنجامی بەرز. |
| سێیەم: بایەخ دان بە قوتابیان و پشتگیری کردنیان. | ١٦– قوتابخانە پشتیوانیەکی کاریگەر دەکات لە بەرەپێشچوونی کەسیەتی قوتابیان. | ١٦–١ قوتابخانە ڕێساو ڕێکاری ڕوونی هەیە بۆ پاداشت کردن و ڕەفتاری باش و ڕاستکردنەوەی ڕەفتاری نەشیاو وە هاندان بۆ ڕێزگرتن لە بەهاو بیروباوەڕەکانی ئەوانی دیکە، ڕێساو ڕێکاری کاریگەرن لە برەودان بە بەهای ئەرێنی و ڕەفتاری بەرپرسیارانە لە لایەن قوتابیەکانەوە.<br><br>١٦–٢ قوتابخانە بە شێوەیەکی کاریگەر هەڵدەستێت بە پەرەپێدانی ئاشتەوایی و ڕێزگرتنی دوولایەنەو خۆشەویستی سروشت و پاراستنی ژینگەو دروست کردنی پەیوەندی بنیاتنەرانە لەگەڵ | قوتابخانەڕێساو ڕێکارەکانی بۆ پاڵپشتیکردنی ڕاستکردنەوەی ڕەفتاری نەشیاو و ڕێزگرتن لە بەها و بیروباوەڕەکانی کەسانی تر نیە، و چالاکی جۆراو جۆرەکانی وەك (هونەری، وەرزشی، ئەدەبی ،پێشبڕکێ ، ... هتد) بۆ قوتابیان | قوتابخانە کەمێك لە ڕێساکانی ڕەفتارکردنی هەیە لەگەڵ هەندێك ڕێکار بۆ پاڵپشتیکردن و ڕاستکردنەوەی ڕەفتارە نەشیاوە کان، و هاندانی قوتابیان بۆ ڕێزگرتن لە بەها و بیروباوەڕەکانی کە سانی تر لاوازە | قوتابخانە ڕێسا و ڕێکاری هەیە بۆ پاڵپشتیکردنی ڕەفتاری باش و ڕاستکردنەوەی ڕەفتاری نەشیاو و هاندانی قوتابیان بۆ ڕێزگرتن لە بەها و بیروباوەڕەکانی کەسانی تر، و قوتابخانە تەنها چالاکی | قوتابخانە ڕێسا و ڕێکاری ڕوونی هەیە بۆ پاڵپشتیکردنی ڕەفتاری باش و ڕاستکردنەوەی ڕەفتاری نەشیاو و هاندانی گشت قوتابیان بۆ ڕێزگرتن لە بەها و بیروباوەڕەکانی کەسانی تر و ئاشتی و تێگەیشتنی دوولایەنە بەشێوەی کاریگەر، و قوتابخانە چالاکی |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کۆمەڵگەدا.<br><br>١٦-٣ قوتابخانە چەند چالاکیەك دەستەبەر دەکات بۆ نمونە، چالاکی هونەری و وەرزشی، هەروەها سەرکەوتوانە هەڵدەستێت بە هاندانی قوتابیان بۆ ئەوەی بەشداری لەو چالاکیانەدا بکەن.<br><br>١٦-٤ قوتابخانە بە شێوەیەکی کاریگەر پەرە بە کارامەییە ژیانیەکانی قوتابیان دەدات و ڕێنمایی پیشەیی باشیان بۆ دەستەبەر دەکات کە گونجاو بێت لەگەڵ تواناو خواستەکانیان لەبارەی ئاییندەیانەوە. | فەرامۆشکردووە . | چونکە قوتابخانە تەنها کەمێك چالاکی جۆراوجۆر ئەنجام دەدات وەك چالاکی (هونەری، وەرزشی، ئەدەبی، پێشبڕکێ ، ... هتد) و پەرەپێدانی کارامەیەکانی ژیان . | هونەری فەرمی ئەنجام دەدات بۆ زۆربەی قوتابیان وەك چالاکی ( هونەری، وەرزشی، ئەدەبی، پێشبڕکێ،... هتد) و پەرەپێدانی کارامەیەکانی ژیان. | هونەری جۆراوجۆر و سەریار ئەنجام دەدات وەك چالاکی (هونەری، وەرزشی، ئەدەبی، پێشبڕکێ، ... هتد) و پەرەپێدانی کارامەیەکانی ژیان . |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١٧– قوتابخانە پاڵپشتی و جەخت لە مافەکانی مرۆڤ دەکات بۆ قوتابیان. | ١٧–١ قوتابخانە هۆشیارە بە پرەنسیپە جیهانیەکانی مافەکانی مرۆڤ و چالاکانە پەرە بە مافەکانی کچان و ئەو قوتابیانە دەدات کە خاوەنی پێداویستی پەروەردەیی تایبەتن لەگەڵ مافەکانی منداڵانی ئاوارە ناوخۆییەکان.<br>١٧–٢ قوتابخانە دەرفەتی گونجاو دەستەبەر دەکات تاوەکو قوتابیان بتوانن گوزارشت لە بۆچونەکانیان بکەن و بە شێوەیەکی کارا پەرە بدەن بە ڕێزگرتن لە بۆچوونەکانی ئەوانی تر.<br>١٧–٣ قوتابخانە پشتگیری لەوە دەکات کە دەرفەتی خوێندن بۆ هەمووان هەبێت و هەنگاوی کاریگەر دەنێت بۆ دڵنیا بوون لەوەی سەرجەم قوتابیان (لە نێویاندا کچان، ئەو قوتابیانەی خاوەنی پێداویستی پەروەردەیی تایبەتن و منداڵانی ئاوارە ناوخۆییەکان) بە ڕێك و پێکی دەوام دەکەن و دانابڕێن و سوودمەند دەبن لەو پەروەردەیەی کە قوتابخانە دەستەبەری دەکات. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە هیچ دەرفەتێك و ژینگەیەکی لەبار ناڕەخسێنێت بۆ فێربوونی قوتابیان و هیچ کام لە پرەنسیپەکانی مافەکانی مرۆڤ جێبەجێ ناکات و خاوەن پێداویستیە تایبەتەکانی بەلاوە ناوە. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە هەندێك لە داخوازیەکانی ژینگەی خوێندن دەستەبەر دەکات، هاوکارە لە تۆمار کردن و گەڕانەوەی ژمارەیەکی کەم لە قوتابیە دابڕاوەکان بۆ پرۆسەی خوێندن و هەندێك لە داخوازیەکانی قوتابیە خاوەن پێداویستیە تایبەتەکان دابین دەکات، وە بەشێك لە مافەکانی مرۆڤ جێبەجێ دەکات. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە ژینگەیەکی لەبار و ئارام دەڕەخسێنێت بۆ زۆربەی قوتابیان و قوتابیە خاوەن پێداویستیە تایبەتەکان و قوتابیە دابڕاوەکان بە مەرجێك گونجاو بێت لەگەڵ مافەکانی مرۆڤ وە سنووردارکردنی دابڕانی قوتابیان لە خوێندن. | دەستەی کارگێڕی قوتابخانە دەرفەتێکی فێرکاری باش، وە ژینگەیەکی لەبارو ئارام دەڕەخسێنێت بۆ گشت قوتابیان و خاوەن پێداویستە تایبەتەکان و دابڕاوەکان بۆ بەردەوام بوون لە خوێندن و فەراهەم کردنی کەشێکی لەبار بۆ دەربڕینی ڕاو و بۆچوونیان و باوەڕ هێنان بە مافەکانی مرۆڤ. |
| | ١٨– قوتابخانە بە شێوەیەکی گونجاو پاڵپشتی قوتابیانی خاوەن پێداویستی پەروەردەیی تایبەت و قوتابیانی بەهرەمەند دەکات. | ١٨–١ قوتابخانە پشتیوانی ماددی و مەعنەوی گونجاو دەستەبەر دەکات بۆ ئەو قوتابیانەی کە خاوەن پێداویستی پەروەردەیی و فێرکاری تایبەتن.<br>١٨–٢ قوتابخانە ئەو داواکاریە یاسایانە جێبەجێ دەکات کە پەیوەستە بەو قوتابیانەی کە خاوەن پێداویستی پەروەردەیی وفێرکاری تایبەتن. | قوتابخانە پاڵپشتی ماددی و مەعنەوی قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەت و قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەتی فێرکاری ناکات، یاساکانی تایبەت بەوان | قوتابخانە گرنگی بە قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەت و قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەتی فێرکاری دەدات و هەندێك پاڵپشتی مەعنەوی دەستەبەر | قوتابخانە پاڵپشتی ماددی و مەعنەوی قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەتی فێرکاری دەکات، قوتابیە بەهرەدارەکان دەست نیشان دەکات زۆر لە چالاکی | قوتابخانە دابین کردنی پاڵپشتی ماددی و مەعنەوی قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەت و قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەتی فێرکاری دەکات ، یاسا و ڕێنماییەکانی |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ١٨-٣ قوتابخانە چەند چالاکیەکی جۆراوجۆر، کە ئامانجی جیاوازیان هەیە، بۆ قوتابیانی خاوەن دەستکەوتی ئاست بەرز فەراهەم دەکات.<br>١٨-٤ قوتابخانە پرۆگرامی خوێندنی تەواوکاری بۆ ئەو قوتابیانەی ئاستیان لاوازە دەستەبەر دەکات. | نایزانێت و چالاکی جیاوازی وەها ئەنجام نادات کە بگونجێت لەگەڵ ئامانجە جیاوازەکانی قوتابیە بەهرەدارەکان و ئەدای قوتابیانی ئاست لاواز باشتر ناکات . | دەکات، و رەچاوی جیاوازی تاکەکەسی ناکات،وە چالاکی هەمەجۆری وەها ئەنجام نادات کە بگونجێت لەگەڵ ئامانجە جیاوازەکانی قوتابیە بەهرەدارەکان و باشترکردنی ئەدای قوتابیانی ئاست لاواز. | هەمەجۆری وەها ئەنجام دەدات کە بگونجێت لەگەڵ ئامانجە جیاوازەکانی قوتابیە بەهرەدارەکان و باشترکردنی ئەدای قوتابیانی قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەت و قوتابیانی خاوەن پێداویستی تایبەتی فێرکاری و باشترکردنی ئەدای قوتابیانی ئاست لاواز. | تایبەت بەوان جێبەجێ دەکات و چالاکیی هەمەجۆری وەها ئەنجام دەدات کە دەگونجێت لەگەڵ ئامانجە جیاوازەکانی قوتابیە بەهرەدارەکان پاداشت کردنیان و باشترکردنی ئەدای قوتابیانی ئاست لاواز . |
| | ١٩- قوتابخانە بە شێوەیەکی کارا بایەخ بە تەندروستی و سەلامەتی و ئاسوودەیی دەروونی قوتابیان دەدات. | ١٩-١ قوتابخانە رێساو رێکاری پێویست دەگرێتە بەر بۆ ئەوەی ژینگەیەکی سەلامەت بۆ قوتابیان دەستەبەر بکات لە رێی گرتنەبەری رێکاری خۆپارێزی لە ئاگرو مەترسیەکانی دیکەی جەستە، دڵنیا دەبێت لەوەی قوتابیان دووچاری پێشێلکاری نابنەوە، هەروەها دڵنیادەبێت لەوەی قوتابیان هۆشیارن مەترسیەکان دەزانن و چۆن پارێزگاری لە سەلامەتی خۆیان بکەن.<br>١٩-٢ قوتابخانە بە شێوەیەکی کارا هەڵدەستێت بە پەرەپێدانی تەندروستی هزری و جەستەیی قوتابیان، بۆ نمونە، لە رێی هەبوونی پەیوەندیەکی باش لەگەڵ دامەزراوە خۆجێیەکان، دەستەبەرکردنی ژووری پزیشکی گونجاو و برەودان | قوتابخانە هیچ ژینگەیەکی تەندروستی ئارامی نیە و هیچ رێوشوێنێك ناگرێتەبەر بۆ پاراستنی سەلامەتی قوتابیان وە بەشداری بە کۆمەڵگای ناوخۆ ناکات وە رێنماییکاری پەروەدەیی هیچ رۆڵێکی پێ نەدراوە وە چارەسەری کێشەی قوتابیان ناکات بۆ بەردەوام بونیان لە خوێندن. | قوتابخانە بەشێك لە رێوشوێنەکان دەگرێتەبەر بۆ فەراهەم کردنی ژینگەیەکی ئارام و تەندروست بۆ پاراستنی سەلامەتی قوتابیەکان لە مەترسیەکان. وە پەیوەندی سنورداری هەیە لەگەڵ کۆمەڵگەی ناوخۆ وە رۆڵی سنوردار دەبەخشێ بە | قوتابخانە زۆربەی رێوو شوێنەکان دەگرێتەبەر بۆ فەراهەم کردنی ژینگەیەکی ئارام و تەندروستی جەستەیی و دەرونی بۆ پاراستنی سەلامەتی قوتابیان لە مەترسیەکان و ودڵنیایی لە تەندروستباشیان، وە پێدانی دەرفەت و بەشداری پێکردنی کۆمەڵگا رۆڵ دەدات | قوتابخانە هەموو رێساو رێوشوێنەکان دەگرێتەبەر بۆ دابین کردنی ژینگەیەکی تەندروست و ئارام بۆ پاراستنی قوتابیان لە مەترسیەکان وە دابین کردنی تەندروستی جەستەیی و دەرونی باش لە رێگەی خۆراکی تەندروست و وەرزش ، هاوبەشی کردنی کۆمەڵگە زیاد دەکات بە شێوەیەکی بەرچاو وە |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بە خواردنی تەندروست لە فرۆشگای قوتابخانەدا.<br>١٩-٣ ڕێنماییکاری پەروەردەیی قوتابخانە لە نزیکەوە کار لەگەڵ مامۆستایان دەکات بە شێوەیەکی کارا پرس و ڕاوێژو پشتیوانی کردن دەستەبەر دەکات بۆ ئەو قوتابیانەی گرفتی دەروونیان هەیەو لەوە دڵنیا دەبێتەوە کە لە قوتابخانەدا گەشە دەکەن و دانابڕێن. | | ڕێنماییکاری پەروەردەیی بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان. | بە ڕێنماییکاری پەروەردەیی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان. | کاراکردنی ڕۆڵی ڕێنماییکاری پەروەردەیی لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەکانی قوتابیان و بەردەوام بونیان لەخوێندن. |
| چوارەم: بەشداری پێکردنی کۆمەڵگە. | ٢٠- قوتابخانە هاوبەشێکی باشی هەیە لەگەڵ کۆمەڵگەی خۆجێی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا. | ٢٠-١ قوتابخانە بە شێوەیەکی کارا پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگەی خۆجێی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا دروست دەکات و لەگەڵیاندا چالاکی ئەنجام دەدات.<br><br>٢٠-٢ قوتابخانە سەرچاوەو شارەزایی زیاتر لە کۆمەڵگەی خۆجێی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بە دەست دەهێنێت کە ئامانجی سوود گەیاندنە بە پرۆسەی فێربوونی قوتابیان و سەلامەتیان. | قوتابخانە پەیوەندی ناکات بە کۆمەڵگە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیەوە، و لەچالاکیەکانی یەکتریدا بەشداریی ناکەن وە سود لە شارەزاییان نابینن. | قوتابخانە تا ڕادەیەک پەیوەندی دەکات بە هەندێك لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیەوە، و لە چالاکیەکانی یەکتریدا بەشداریی ناکەن وە کەمێك سود لە ئەزمونیان دەبینن. | قوتابخانە پەیوەندی دەکات بە کۆمەڵگە و زۆربەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیەوە، و زۆرجار لەچالاکیەکانی یەکتریدا بەشداریی دەکەن و سەرچاوەی ماددی ( پارە و پەرتوك و ... ) و شارەزایی سەربازیان بۆ دەستەبەر دەکات. | قوتابخانە بەشێوەیەکی کاریگەر پەیوەندی دەکات بە کۆمەڵگە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەی مەدەنیەوە، و لەچالاکیەکانی یەکتریدا بەشداریی دەکەن و سەرچاوەی ماددی ( پارە و پەرتوك و ... ) و شارەزایی سەربازیان بۆ دەستەبەر دەکات کە بە قازانج دەگەڕێتەوە بۆ فێربوونی قوتابیان و خۆش گوزەرانیان . |
| | ٢١- قوتابخانە بە شێوەیەکی کارا هەڵدەستێت بە دروست کردنی پەیوەندی و هاوکاری لەگەڵ دایباباندا و بەشداریان پێدەکات لە پشتیوانی کردنی | ٢١-١ قوتابخانە زانیاری گونجاو بۆ دایبابان دەستەبەر دەکات کە پەیوەستن بە بەرەوپێشچوونی منداڵەکانیانەوەو بە شێوەیەکی کارا لەگەڵ دایباباندا دەکات بۆ دڵنیا بوون لەوەی منداڵەکانیان بە ڕێك و پێکی دەوام دەکەن لە | قوتابخانە هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ لە دایبابان نیەو کۆبونەوەیان لەگەڵ ناکەن، وە بە شێوەیەك کە دایبابان هیچ | قوتابخانە لەگەڵ بەشێك لە دایبابان لە پەیوەندی دایە وە کۆبونەوەی ڕۆتینیی بێ ئەنجام دەکات، وە زانیاری پێویست | قوتابخانە پەیوەندی دەکات بە زۆربەی دایبابان لە میانەی کۆبونەوەکان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان | قوتابخانە لە پەیوەندی بەردەوام دایە لەگەڵ دایبابان و هاوکاریەکی کاریگەرو چالاك ئەنجام دەدات لەگەڵیان بە کۆبونەوەو پەیوەندی |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | فێربوونی منداڵەکانیان و دەستکەوتەکانیان. | قوتابخانەو پشتیوانی لە فێربوونی منداڵەکانیان دەکەن.<br>٢١-٢ قوتابخانە ئەنجومەنێکی چالاکی دایبابان و مامۆستیانی هەیە، بەردەوام پەیوەندی لەگەڵ دایباباندا دروست دەکات، لە ڕێی ڕێکخستنی کۆبونەوە، ناردنی هەواڵنامە، بڵاوکردنەوەی زانیاریەکان لەسەر وێبسایتەکەیان (پەیجی قوتابخانە).<br>٢١-٣ قوتابخانە هەوڵ دەدات ڕای دایبابان وەرگرێت لە بارەی پرسە پەیوەندیدارەکانەوەو ئەو ڕایەش دەنرخێنێت و سەرکەوتوانە هانیان دەدات بۆ ئەوەی بەشداری لە چالاکیەکانی قوتابخانەدا بکەن. | زانیاریەکیان لەسەر تواناو پابەندبوونی ڕۆڵەکانیان بە دەوام نی یە.وە ئەنجومەنی دایباب کارا نیە. | لەسەر قوتابیان ناگەیەنێت بە دایبابان. | زانیاریان پێدەدات لەسەر پێشکەوتنی منداڵەکانیان ، و بەردەوام بوونیان لە دەوام ، وە ڕوونکردنەوەی بەشداری ئەنجومەنی دایبابان لە چالاکیەکانی قوتابخانە. | کۆمەڵایەتی و پێدانی زانیاریەکانی تایبەت بە ڕۆڵەکانیان دەبەخشێت، وە هەردەم هانی دایبابان دەدات بۆ بەشداری کردن لە چالاکیەکانی قوتابخانە. |
| پێنجەم: ئەنجامەکان و دەرهاویشتەکان | ٢٢- قوتابیان خاوەن بەهای ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی باشن و دەزانن چۆن پارێزگاری لە تەندروستی و سەلامەتی خۆیان بکەن. | ٢٢-١ قوتابیان لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین و هاوکاری یەکتر دەکەن و لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە هەست بە بەرپرسیارەتی دەکەن و توانایەکی باشی پەیوەندی کردنیان هەیە.<br>٢٢-٢ قوتابیان بە باشی ڕەفتار دەکەن و بەهای ڕەوشتی باشیان هەیەو پابەندن بە ڕەفتاری باشەوە.<br>٢٢-٣ قوتابیان ئەوە نیشان دەدەن کە هۆشیارن بە مەترسیەکان و دەشزانن چۆن پارێزگاری لە | قوتابیان هەڵسوکەوتی نەشیاو هەیە و هیچ زانیاریەکیان نیە لەسەر پارێزگاری لە سەلامەتی و تەندروستیان. | هەندێ لە قوتابیان خاوەن بەهای ڕەوشتی و کۆمەڵایەتین وە هەندێکی تریان هەڵسوکەوتی نەشیاویان هەیە بەجۆرێك زانیاریەکی کەمیان هەیە لەسەر سەلامەتی و تەندروستی وە ئاراستە کردنیان لاوازە . | زۆربەی قوتابیان خاوەن بەهای ڕەوشتین و پەیوەندی کۆمەڵایەتیان هەیە وە ڕەفتاریان گونجاوە و ئارامن وە گرنگی بە پاراستنی تەندروستیان دەدەن وە خۆیان دەپارێزن لە مەترسیەکان چونکە ئاراستەی باش کراون . | گشت قوتابیان خاوەن بەهای ڕەوشتی بەرزن وە ڕەفتاریان ئارام و گونجاوە ، هاوکاری و پەیوەندی کۆمەڵایەتی کارا لە نێوانیاندا هەیە سەبارەت بە تەندروستی و سەلامەتی و گرنگی بە پاك و خاوێنی دەدەن چونکە زۆرباش ئاراستە کراون |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | خۆیان دەکەن.<br><br>٢٢-٤ قوتابیان بایەخ دانی خۆیان نیشان دەدەن بۆ ئەوەی ژیانێکی تەندروست ببەنە سەر ، خۆیان و دەوروبەرەکەیان بە پاك و خاوێنی ڕابگرن. | | | | |
| ٢٣- ئاستی زانستی قوتابیان باشە و بەرەوپێشچووە. | ٢٣-١ ئەنجامی تاقی کردنەوەکان دەریدەخات کە بە تێپەڕبوونی کات، قوتابیان لە هەموو تواناکاندا پێشکەوتنێکی باشیان بەدەست هێناوە.<br><br>٢٣-٢ قوتابیان ئەنجامی باشیان بەدەست هێناوە کە لەگەڵ تەمەنیان گونجاوە.<br><br>٢٣-٣ کارو بەشداری کردنی قوتابیان زۆر باشە یاخود بە تێپەڕبوونی کات ئاماژەی بەرەوپێشچوون بەدی دەکرێت.<br><br>٢٣-٤ ڕێژەی کەوتن نزمە یاخود داکشاوە. | ئەنجامی کۆتایی قوتابیان لە نزمترین ئاستدایە وڕێژەی دەرنەچوان زۆرە بە جۆرێك ڕێژەی دەرچون بەگشتی کەمترە لە ٪٦٠. | ئەنجامی کۆتایی بەشێك لە قوتابیان بە جیاوازی تواناکانیان دەریدەخات کە ئەنجامی قوتابیان خوار ناوەندە، و ئەنجامی دەرچووەکان لەگەڵ تەمەنیان گونجاو نیەو ڕێژەی دەرچوان بەجۆرێك ٪ ٦٠ بەرەو سەر و کەمتر لە٪٨٠ دەبیت وە ئەنجامەکان بە گشتی تا ڕادەیەك گونجاوە لەگەڵ تەمەنیان . | ئەنجامی کۆتایی زۆربەی قوتابیان بەگشتی بە جیاوازی تواناکانیان دەریدەخات ئەنجامی باشیان بەدیهێناوە کە دەگونجێت لەگەڵ تەمەنیان و، بەدی کردنی پێشکەوتن لە ئەنجامەکان و ڕێژەی دەرچوان بە تێپەڕبونی کات ٪٨٠ بەرەوسەر و کەمتر لە ٪٩٥ وە لەگەڵ تەمەنەکانیان گونجاوە. | ئەنجامی کۆتایی قوتابیان بەگشتی دەریدەخات کە ئەنجامی زۆرباشیان بەدەست هێناوە کە دەگونجێت لەگەڵ تەمەنەکانیان و بە بەرەوپێشچوونی ئەنجامەکانیان دەناسرێنەوە و ڕێژەی کەوتن گەیشتۆتە نزمترین ئاست بەجۆرێك ڕێژەی دەرچوون ٪٩٥ و بەرەوسەر وە ئەنجامەکان زۆر باشەو سەرو ئاستی تەمەنیانە. |
| ٢٤- قوتابیان و دایبابانیان ڕازین لەو پەروەردەیەی لە لایەن قوتابخانەکەوە دەستەبەر دەکرێت. | ٢٤-١ قوتابیان و دایبابانیان ڕای ئەرێنی خۆیان دەردەبڕن لە ڕاپرسی و کۆبونەوەکاندا، بە باشی بەشداری لە چالاکیەکانی قوتابخانەدا دەکەن.<br><br>٢٤-٢ قوتابخانە ناوبانگێکی باشی هەیەو خواست | قوتابیان و دایبابان بۆچوونەکانیان دەرنابڕن وە بەشداری ناکەن لە چالاکیەکانی قوتابخانە وە خواست بۆ وەرگرتن | ژمارەیەکی کەم لە قوتابیان و دایبابان بۆچوونەکانیان لە فۆرمی ڕاپرسی و کۆبوونەوەکاندا دەر | قوتابیان و دایبابان تا ڕادەیەکی باشە بۆچوونە ئەرێنیەکانیان لە فۆرمی ڕاپرسی | گشت قوتابیان و بەخێوکاران بۆچوونە ئەرێنیەکانیان لە فۆرمی ڕاپرسی و کۆبوونەوەکان دەردەبڕن ،و بەشداری |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | لەسەر وەرگرتنی قوتابی زۆرە.<br>٢٤–٣ ڕێژەی دەوام کردنی قوتابیان باشە، یاخود بەرەپێشچووەو ڕێژەی کەوتن و دابڕان و نەهاتن کەم بووە. | لەم قوتابخانەیە نیە.وە تێکڕای دەوام کردنی قوتابیان کەمترە لە٪٨٥ . | دەبڕن، بەشداری پێکردنی لاواز لە هەندێك لە دایبابان هەیە لە چالاکیەکانی قوتابخانە، وە داواکاری بۆ وەرگرتنی قوتابی کەمە. تێکڕای دەوام کردنی قوتابیان لە٪٨٥ و بەرەوسەر و کەمترە لە٪٩٠. | کۆبونەوەکاندا دەردەبڕن، و بەشداری بە زۆرێك لەدایبابان دەکەن لە چالاکیەکانی قوتابخانە،و خواست بۆ وەرگرتنی قوتابیان لەم قوتابخانەیە باشە وە ڕێژەی دەوامکردنی قوتابیان لە٪٩٠ بەرەوسەر و لە٪٩٥ کەمترە. | کاریگەر بە دایبابان دەکەن لە چالاکیەکانی قوتابخانە، داواکاریی بۆ وەرگرتنی قوتابیان لەم قوتابخانەیە زۆریاشە بەهۆی ناوبانگی زۆرباش، ڕێژەی دەوام کردنی قوتابیان لە (٩٥٪) بەرەوسەر و نەهاتووان کەمترە لە (٥٪). |
| | ٢٥– قوتابیان پەرە بە کارامەییە هزری و کۆمەڵایەتی و ژیریەکانیان بە شێوەیەکی باش دەدەن. | ٢٥–١ قوتابیان کارامەییەکی باشی لێکۆڵینەوەو چارەسەرکردنی کێشەو داهێنان نیشان دەدەن.<br>٢٥–٢ ژمارەی قوتابیە هەڵکەوتوەکان زیادی کردوەو ئەدایەکی باشیان هەبووە لە پێشبڕکێکاندا.<br>٢٥–٣ ڕێژەیەکی باشی قوتابیان سەرکەوتوانە هەنگاویان ناوە بەرەو قۆناغی داهاتووی خوێندن. | قوتابیان هیچ کارامەیی و داهێنان و چارەسەری کێشەکانیان نیە، ئاماری قوتابی هەڵکەوتوەکان نیە، وە ڕێژەی سەرکەوتنیان نزمە. | بەشێك لە قوتابیان کارامەیی و داهێنان هەروەها چارەسەرکردنی کێشەکانیان هەیە لەگەڵ بوونی ئاماری بەشێك لە قوتابیە هەڵکەوتوەکان و ڕێژەیەکی ناوەند لە دەرچوون بۆ قۆناغی داهاتوو. | زۆریەی قوتابیان کارامەیی داهێنانیان هەیە وە توانای چارەسەرکردنی کێشەکانیان هەیە و ئاماری زۆریەی ڕێژەی قوتابیە هەڵکەوتوەکان وە دەستەبەرکردنی ڕێژەیەکی باش لە قوتابی لێهاتوو. | گشت قوتابیان کارامەیی داهێنان و چارەسەرکرنی کێشەکانیان هەیە وە زۆربونی دەرهاویشتەکانی، فێربوون لە ئاستی باڵادایە، هاتنەدی ڕێژەیەکی زۆرباش لە سەرکەوتن. |